بلێ شێخ نوێژی کرد و نووستەوە بۆی
خەلیفە نوێژی بۆ خەڵکی بکا خۆی»
خەلیفە پێکەنی و زانی چ باسە
گوتی: «باوکم بە قوربانی بێ، خاسە»
وڵات روون بوو، کتێبی دەستی دانا
خەریك بوو تازە بنوێ لاوی زانا
کە دایکی کردیە هاوار و [بە] فریاد
بە خۆیدا دا گوتی: ئەی داد و بێداد!
چ بوو تاوانی ئەم جووتە فەقیرە
کە وایان لێ بکا ئەم گورگە پیرە
ئەوە کار بوو کە کردی ئەم یەکانە
پەژارەی خستە شاری بەم بەیانە
بە قوربانت دەبم بینایی چاوان
قوبووڵی بۆ دەکەی تۆ سووچ و تاوان؟
خودایا بەس بدە دەستی ئەمیری
خەراپە، بەدفەڕە، بۆ خۆت خەبیری
هەتا کەنگێ دەدەی تۆ بەخت و هاتی؟
دەزانی چەند دڕە؟ نەحلەت لە زاتی!»
گوتی: «دایە! چیە ئەم بۆڵە ـ بۆڵە؟»
گوتی: «هەستە، سەلام لێ رابوو، ڕۆڵە!

ئەمیر ئەمڕۆ لە داری دان بە جووتە
کچۆڵەی خۆی و ئەو خۆشخوانە رووتە
لە شاری کەوتووە هاوار و گریان
دڵی گەورە و پچووکان بۆتە بریان»
ئەوەی گوت کەوتەوە ئاه و نزوولە:
«خودایا چەند بەدە ئەم میرە خوولە!
دڵی کوو هات بکووژێ ئەم گوڵانە
لە یەکتر کا بە ناهەق ئەم دڵانە
خودای گەورە! بە دەس خۆتە هەموو کار
لە سەرمان لابەرە بێدادی خوونکار
لەسەر دڵداری نۆلاوان دەکووژێ
کوڕ و کیژان لە پێش چاوان دەکووژێ!»
گوتی: «پاڕانەوە بێکەڵکە، دایە!
نزوولە قەت دەرۆستی زوڵمی نایە
نەزانە تاکوو خەڵکی ئەم وڵاتە
بە دەس میرانەوە ئەم دەستەڵاتە
دەئاژۆن، رادەدەن تا بلوێ بۆیان
هەموو کارێ دەکەن بۆ سوودی خۆیان
بپارێزن هەتا ئەم موڵك و ماڵە
وە بەر پێیان دەدەن مسکێن و پاڵە

ئەوان پێیـان بـڕێ دەسـکەوت و قـازانج
بە قورِ گـیرێ دەبـا سـەد ماڵـە کرمـانج
ژن و پیـاو و کـورِ و کیـژان دەکـووژن
قـسەتوند و قەڵـەمتیـژان دەکـووژن
هـەتا خـەڵکی لـە یـەکتر وا نـەبانن
ئەوان سواریان دەبـن، سـواریش دەزانـن
هـەتا مـیرزا حیکایـەتخـوانی مـیرە
مەپرسـە دایـە لـەم کوشـت و بگـیرە
هـەتا کیـژی هـەژاران مەشـکەژێنە
لـە مـاڵی وان هەیـە ئـەم بێنـە ـ بێنـە
هـەتاکوو هێـزی ئـەم خەڵکـە نـەجووڵێ
هـەزار پاڕانـەوەت دایـە بـە پـووڵێ!
کە ژن زانی ئـەویش ئینسانە وەك مێـر
مـەڕی مـیری ئـیتر نایێتـە سـەر بێـر
کـە وریـا بوونـەوە پاڵـە و کرێکـار
دەشێوێ ماڵی میر و مـەزن و خوونکـار
کـە مـیرزا بـوو بـە ڕۆشـنبیری تـازە
حـوکم ناکـا لـە سـەرمان مـیری تـازە
هەزار ڕەحـمەت لە گۆڕی بێ کچی مـیر
قسێکی کـرد کـە پەنـدە بـۆ کـوڕی ژیـر

بــە زۆر بـشكێ دەبــێ دەركــی قەڵایــە
دەنــا ئــەو دەركــە بــۆ كــێ ئاوەڵایــە؟!
خــەبات رزگــار دەكــا كۆیلــە و ئەســیران
لــە ناخــێ رادەكــا مــەزن و ئــەمیران
بــە ئەفــسانەی دەزانــن ســوورِی دەوران
غــوڵام و وركــەخۆری دەركــی گــەوران
بــەڵام دەوران دەبــێ رۆژێ بــدا ســوورِ
لەبەر گەوران نەبێ پشتی خــەڵك كــوورِ
كــە گۆپــاڵی خــەڵك دەرهــات لــە خیــزی
ئــیتر نامێنــێ مــیری گــەورە فیــزی»

١٩٧٨/٢/١

## شەرابی خەست

جێژنی نەورۆزە، شەرابم خەستترە
تا نەڵێن بولبول لە شاعیر مەستترە
جوانی گوت شۆخی لەباری بادەگێڕ:
«ئەو کەسەی سەرمەستترە، سەربەستترە»
«مَی آنچنان را آنچنانتر می‌کند»
شاعیری دەروەست بە مەی دەروەستترە
چیمەنی شێلا بە شایی کیژی کورد
وەی دڵم لەو چیمەنە پێ پەستترە
من بڕستم لێ بڕا یا کیژی شار
زۆر لە کیژی دەشتەکی بەیدەستترە

١٩٧٨

## ریژنه

تۆ بەڵێنم پێ بدە تا من بەرەو ژوان ببمەوە
بمدەیە ماچێکی تەڕ لەم لێوە با جوان ببمەوە
دەستی لەرزۆکم هەتا تێیدایە هێزی بەی گوشین
لێمگەڕێ تاوێ لە باخی سینە میوان ببمەوە
شەنگەبێری! بسڕەوە فرمێسکی بێشوانی ئیتر
ڕەنگە هێشتا لەو چیا و زۆزانە بۆ شوان ببمەوە
من گوڵی سەر گۆڕی ئاواتی لەمێژینەم بەڵام
ڕێژنێکم لێ بدا پێم وایە بۆ ڕوان ببمەوە
شێخی سەنعان بۆ کچی گاور لە ئیسلام وەرگەڕا
من خەریکم بۆ کچە شێخێ پەژیوان ببمەوە

١٩٧٨/٧/١٩

## بەهاری زەرد

بۆ لەیلا قاسم

هەمیشە دەرد دەبینم، دەرد دەبینم
درۆی دوژمن، دەهۆی نامەرد دەبینم
مەگەر زەردایی ناکەن چاوەکانم
کە رەنگی نەوبەهاری زەرد دەبینم
بە سۆزەی با کە سکڵی دڵ گەشاوە
دەروون پڕسۆز و فرمێسکم خوناوە
لەدووی لەیلا بە واوەیلا وو شیوەن
دەرۆم و پۆلی شینگێرم بە دواوە

بــزەی هــاتیّ گــوتی: رووناکــه ئاســۆم
وەرە جــەللاد پــەتت باوێــژە ئەســتۆم
ئــەوە پــەت نیــە مێــدالّی ئیفتیخــارە
کــە بوومــە قارەمــانی میللــەتی خــۆم
ئــەوەی بیــست شــاعیر و گریــا بــە زاری
ئەگەرچــــی بەســــترابوو لێــــو و زاری
گــــوتی: لــــەیلا هەمیــــشە پایــــەداری
لــە ژێــر خاکــا لــە پــێش چــاوان دیــاری
کە تۆ تــۆرای لــە چــاوان وەك خــەوی مــن
لــە بــسکت رەشــترە مانگەشــەوی مــن
برۆ مــەجنوون! بە لەیلاکەی خۆت مــەنازە
کــە ناوبــانگی پــتر رۆیــی ئــەوی مــن

**گۆڤاری سروە، ژمارە ١، بەهاری ١٣٦٤-١٩٨٥**

## زینده بەچاڵ

پڕ نەبێ جامی بەتاڵم تا کەی؟
نەشەکێ باڵی خەیاڵم تا کەی؟
هاوسەر و دەستەملانی ژانم
گیانەکەم! نایەوە باڵم تا کەی؟
شەو لە تاریکی و بێدەنگیدا
ڕۆژەکەم! بۆ تۆ بناڵم تا کەی؟
هەر لە یادی سەری بسکتدا بم
گیانە! ئاشوفتە بێ حاڵم تا کەی؟
هەر منەتباری شەراب و مەی بم
حەسرەتی چاوی کەژاڵم تا کەی؟
هەر لە ماچی دەمەکەت بێبەش بم؟
لێوی وشك و دەمی تاڵم تا کەی؟

هەوەسی گەستنی کوڵمەم تا چەند؟
ئارەزووی مشتنی خاڵم تا کەی؟
شینە میوانی شەوانی دووریم
شادی! روو ناکەیە ماڵم تا کەی؟
من لە دوورەنگی بە دڵ بێزارم
رەنگی زەرد، دیدەیی ئاڵم تا کەی؟
من وەکوو هەنگێ هەڵاڵەم مشتوون
ژینی نێو گەند و هەڵاڵم تا کەی؟
من بە شێلانی چەمەن راهاتم
هاتوچۆی نێو درِ و داڵم تا کەی؟
بۆ سەرینچاوە وو کانیاوی روون
هەڵوەریێ ئەشکی زولاڵم تا کەی؟
من هەڵۆ بووم و چیا هێلانەم
ژێرچەپۆکی قەل و داڵم تا کەی؟
قەفەزی دوژمنی بەدخووی دڵرِەق
هەڵوەرینێ پەرِ و باڵم تا کەی؟
سەرەنێزەی ستەم و زۆرداری
بنجنێ سینگی مەتاڵم تا کەی؟
گورگی بێدادی لە گیانم بەر بوو
ئێشی جێ گاز و قەپاڵم تا کەی؟

مــــن پەلـــەقاژە وو هـــاوارێ نەکـــەم
ئـــەو بڵـــێ زاڵـــم و زاڵـــم تـــا کـــەی؟
کوتکی بێدادی هەر بکوتێ کاسە سەرم
کـار نـەکا دەسـت و زوخـاڵم تـا کـەی؟
ئـــەو کـــە زاری رقـــی دەرکێـــشاوە
مـــن زمـــانبەســـتە وو لاڵـــم تـــا کـــەی؟
پۆشـــتە وو تێـــر و پـــڕ و خـــۆشلـــەوەڕە
برســـی و رووت و رەجـــاڵم تـــا کـــەی؟
تـــەم و مـــژ، بەنـــدەن و دەشـــتی گرتـــم
هەڵنـــەکا ســـروە شـــەماڵم تـــا کـــەی؟
بـــەس نـــەبێ دەسبەســـەری و دەربـــەدەری
نەچـــمەوە نێـــو کـــوڕ و کـــاڵم تـــا کـــەی؟
باخـــــەوانانی جیهـــــان پـــــێم نـــــاڵێن
بـــۆ وەری میـــوەیی کـــاڵم تـــا کـــەی؟
مـــانگ و مێریـــخی دەپێـــوێ ئینـــسان
مـــنی کـــورد زینـــدە بەچـــاڵم تـــا کـــەی؟
چـــاوەڕێی تیـــشکی هـــەتاوی هیـــوام
نـــەڕەوێ هـــەور و گـــەواڵم تـــا کـــەی؟

١٩٧٦/١١/١٥

## بەهار هەر دێ

لە گیاندانا دەگورێنم بژی هەر کورد و کوردستان
بە گوللەی دوژمنانی گەل دڵیشم بێتە راوەستان
پشووی دواییم دەخوێنم بۆ گوڵ و گوڵزاری ئەم خاکە
لە سایەی ئەم گوڵ و گوڵزارەیە بوومە هەزاردەستان
دەزانن زامی دیلی چەند بە ئێش و چەند بە ئازارە؟
دەبێ رابێین هەتا ئێمەش دەگەینە رێزی سەربەستان
خەتای خۆمانە تا ئێستا کە هەروا کۆیلە وو دیلین
ئەوانەی شاد و ئازادن کەمێ زووتر لە خەو هەستان
نەتاندیوە کە رووباری خوڕین بەردی دەقەڵشێنێ
وەهاشە هەر کە زۆرداری دەسووتێنێ گڕی هەستان

لــه مەیــدانی شەڕانــخێوی خــەباتی قــەڕنی بیــستەمدا
سەرم سووڕما کە ئەسپی سووکەسواری کوردی بـۆ وەسـتان؟!
وەڵامـــی دامــــەوە پیرێکـــی ئـــازادەی جەهاندیـــدە:
خەتای سواران نەبوو پـێش سوارەکانـمان قـورس و ناوەسـتان
هومێـدێ بەرمـــەدەن رێگــەی خــەبات بگــرن بڕۆنــە پــێش
تەماشـای خـەڵکی تێکۆشـەر بـە دیکتـاتۆڕی چـۆن وەسـتان!
هـــەتا کـــەنگێ سیاچـــاڵی بەســـامی دوژمـــنی زاڵـــم
پراوپڕ بێ لە رۆڵەی گـەل، جـمەی بـێ وا لـە دەس بەسـتان؟
هەتاکـەی ئەشـکی خـوێنینی کـچە کـوردی بـرا کـوژراو
لـەجێی بـادە و لـە بـەزمی دوژمنـان بدرێتـە دەس مەسـتان
مەترســـن رۆڵـــەکانی قارەمـــانی گـــەل لـــە گیانبـــازی
لـە کـۆڕی ئـەم خەباتـە بـێوچـانە تاقـە یـەك کەسـتان
ســـەهۆڵبەندانی بێـــدادی ئەگەرچـــی تـــووش و دژوارە
بەڵام لێم سـوورە وەك رۆژێ بـەهار هـەر دێ لـەدووی زسـتان
بــە خــەڵکی عالــەمی سەلــماندووە تاریــخی ئــازادی
دەبـــێ زاڵـــم لەبـــەر تێکۆشـــەران بەرداتـــەوە دەســـتان

١٩٧٧/١١/٩

## ڕەوەز ورد نابێ

زەوی! ئێستاش لە ڕووت هەڵدێ بدەی سوورڕ؟
نــەڕووخای ئاســمانی پــیری پــشت کــووڕ؟
کـــە حـــاڵی زارمـــان ئـــاوا دەبیـــنن
کـــە مـــاڵی زاڵمـــان ئـــاوا دەبیـــنن
کــە مـــەرگی کاوەکـــانی چـــاک دەبیـــنن
کــە جــەرگی کیــژەکان پــڕ چــاک دەبیــنن
کــە کــۆڕی شــین، بــەهاری ســوور دەبیــنن
«ئــەمین»ی نــا ئــەمین مــەئموور دەبیــنن

کە بووکی سووری بێ زاوا دەبینن
کرووزەی بێ گونای ساوا دەبینن
کە سۆمایی لە چاو باوکان براوە
بەرۆکی پیرە دایکان دادڕاوە
کە کوندی شووم لە گوندی کورد دەخوێنێ
کە گەنجی کورد دەگەوزێنێ دە خوێنێ
کە تەختی بەختی کورد بێ خێو دەبینن
«سولەیمانی» ئەسیری دێو دەبینن
بناری لێژ و ناهەمواری هەڵگورد
دەبینن بۆتە دەشتی کەربەلای کورد
بە ناهەق خوێنی تێکۆشەر دەڕێژن
شەهیدی بێ سەر و بێ شوێن دەنێژن
بەڵام با تێبگا ئەو دوژمنەی پەست
ڕەوەز ورد ناکرێ هەرگیز بە داردەست
دەبێ کوند هەر بەرەو وێرانە بفڕێ
هەڵۆ لەو کێوە سەربەرزانە نەبڕێ

١٣٥٨/٢/٢٧

## بەهاری ئاڵ

لەمێژە ئاواتی منە
ببینم وڵاتی سنە
زێدی کۆن و ڕەسەنی کورد
بە درێژایی تەمەنی کورد
ڕوانگەی هەزاران کارەسات
بنە و مەتەرێزی خەبات
شوورەی سەختی بەرەنگاری
پاردەی وەختی فیداکاری
بۆسەی پێشمەرگەی کۆڵنەدەر
گۆڕخانەی سوپای داگیرکەر
بچمە لانی بەچکە شێران
قەڵاگای تەنگانەی مێران
جێ پەیکانی تیر ئەنگێوان
جێی پێکانی دەسبزێوان

خـــاکی نەتـــەوەی نەبـــەزم
هــەر گوتوویــە نــەزم، نــەزم
تێـر ـ تێـر بڕوانــمە دیــمەنی
لــە خۆشــیانی بــبم خــەنی
چــاو بگێــڕم لــە رژد و لێــژ
تــا بــرینم بــبن ســارێژ
دانیــشم لــە بــن دەوەنــێ
بڕوانــمە مێــرگ و چــەمەنێ
هەڵمــژم هــەوای زەنــوێران
خــۆ دەمــە بــەر ئاوهەڵــدێران
هەڵگــەڕێم بــە راز و زەردان
بــەر دەمــەوە جاڵــە بــەردان
لــە بــان رەوەزان بــخوێنم
کــەوی بــەیان وەدەنــگ بێــنم
لــەو رنوانــە بکــەم رەوت
دوژمــن بــۆی نــەکراون زەوت
لــە مــشارەیەك داگــرم پــێ
نەتــەوی کــرد ســەرەنگرێ
تــۆزی بــەردێ بکــەم بــە کــل
«کە گەردوون پێــی نــەداوە تــل»

وەك گۆرانی هەورامان پێو
پێ بنێمە سەر «پێپیلکەی دێو»
دانووسێم بە کانیاوی روون
رابکشێم لەسەر هەڵەسوون
چەپکێ وەنەوشە بچنم
دەسکێ سوێسنە بڕنم
خۆم لە تیشێکی بکەم بەند
هەڵپسێنم چڵێ گیابەند
ئەشکەوتێ نەچێ لە بیرم
پەناگا بوو بۆ باپیرم
بگرم گەوە و پێچ و خەمی
بچمە سەر دوندی ئەستەمی
لەسەر کێوی بەرزی ئارێز
کوردستان بگرمە ئامێز
بە جوانی ئەو خۆرِسکاوە
روون بنەوە ئەم دوو چاوە
ئەم چاوانەی گەلێ ماوە
لە سوێی کوردستان گریاوە
ئەم چاوانەی فرمێسکیان رشت
بۆ کوردێکی دوژمن دەیکوشت

ئەم چاوانەی داگیرساون
هێند لە شینگایان گریاون
چم پێ دەڵێن لێر و لەوێ
من کوردستانم خۆش دەوێ
پێشم بڵێن ونی و دێوی
دەپەرستم چڕ و کێوی
جا دەگەڕێمەوە پێدەشت
بە لادێیاندا بکەم گەشت
ببینم دێم و بەراوی
بوورەی گاسن لێ نەدراوی
کێڵگەی بە ڕێژەوو نەرمان
بەڵام بێ خۆیان و خەرمان
نە سەد، نە بناوان و نە بەند
جۆگەی جۆماڵ نەکراوی مەند
ئەستێری پڕ بووەی بۆگەن
پڕ لە لیتە و سێسوو و جەگەن
جووتیاری نازا و توند و تۆڵ
گاجووتی لەڕ و گاسنی کۆڵ
برسی، هەژار، بێدەرەتان
ڕەشن و ڕووت و بێ تۆو و نان

دەستی قەڵشیو، پێ راگیراو
گیرفانی دڕاو، بێ دراو
پاڵەی سواڵە هۆنی بە گورد
چەقڵی چاوی دژمنی کورد
خانووی کاول و رەش و برش
هەر نانی رەق و دۆی ترش
بۆی کرا درۆ و دەلەسە
کوا رێگا و بان و مەدرەسە؟
نەك مافی جووتیار نەدراوە
لادێمان خاپوور کراوە
سەرگەردان بوون لە نێو تۆڕا
بەوەی نیە نێویان گۆڕا
بۆ زەحمەتکێشی قارەمان
نە دوکتۆر هەیە نە دەرمان
بێبەهرەن لە خوێندەواری
خوێندەواری و کوردەواری؟
هەتا هێزی خەڵك بزووت
بوو بە مەشخەڵی گەش بزووت
خەڵکی تێکۆشەر خۆی دەرخست
بەگژ ئەرتەشدا چوو بە مست

راپـــەڕینێك بـــوو بـــیٚوێنـــە
وڵات دەتگـوت، گـۆمی خوێنـە
دیکتـاتۆر بـۆ پاراسـتنی خـۆی
کـردی هەرچـی کـە دەکـرا بـۆی
بـــە دەســـتی ســـتەم و تـــاوان
ڕژا خــــوێنی شــــۆڕەلاوان
زۆرداری بـــۆ زۆر مانـــەوە
بـــە ڕق هاتـــە مەیدانـــەوە
بـــێبـــەزەیی دەســـتی وەشـــاند
خـــوێنی ژن و پیـــاوی ڕژانـــد
زگـــی بـــاوکی پـــیری ســـووتاند
ڕۆڵـــەی لەبـــەر دایـــك ڕفانـــد
ویـــستی خـــاکی پـــاکی ئێـــران
ئەوەنـــدەی دی بکـــا وێـــران
بـــەڵام خـــەڵکی لـــە گیـــان بێـــزار
داینەنوانـــد لەبـــەر زۆردار
لـــە تانـــك و تـــۆپ نـــەپرینگاوە
گـــوێی بـــە گوللـــە نـــەزرینگاوە
پێـــی داگـــرت، چـــەقی نەبـــەزی
تـــا داگیرکـــەر گورچـــووی تـــەزی

کـوردیش بەشـداری خـەبات بـوو
رۆڵــەی رۆژی کارەســات بــوو
لاوی گیــان فیــدای گیــان فیــدا
ئازایانـــــە، شـــــەهیدی دا
لـــە خـــەباتی خوێناویـــدا
لـــە هـــەرەتی تەنگاویـــدا
کوردســتان هــەر بــوو بــە قــەڵا
دیــتی هـــەزار دەرد و بـــەڵا
ئێــستا دەڵــێ خــوێنی گەشــم
بۆ شـۆڕش رشـتووە کـوا بەشـم؟
دژی زۆرداری بـــووم، هـــەر وام
هـــەر دەمـــەوێ مافـــی رەوام
دەمـــەوێ بگـــەم بـــە نیـــاز
نـــاوم مـــەنێ جیـــاوازیخـــواز
کەچـــی پۆلێـــك کۆنەپەرەســـت
بـــۆ بێگانـــە بوونـــە داردەســـت
لـــە بـــەهاری ئازادیـــدا
لـــە کـــاتی خۆشـــی و شـــادیدا
خراپـــە کەوتـــەوە بـــرەو
تەمایـــە رۆژ بکـــا بـــە شـــەو

سنەی جوانی خوێناوی کرد
درۆ و فێڵ و ناپیاوی کرد
ناپاک هاتەوە کایەوە
داوی بۆ خەڵك نایەوە
دەگرێ، دەکوژێ، دەبڕێ
شەڕ دەفرۆشێ، زگ دەدڕێ
ژن و منداڵ ناپارێزێ
لێمان دەگرێ مەتەرێزێ
راوەڕووتە و خانەبگیر
گرمەی تۆپە و قرمەی شێستتیر
زەبر و زەنگی خۆی دەنوێنێ
لاوان لە خوێن دەگەوزێنێ
کوردستان بەهاری ئاڵە
جا بە خوێن بێ یا بە گوڵاڵە

١٣٥٨/١/١٠

## فرمێسکی ڕوونوو

تــــۆ گوتـــت: «مـــن ئاشـــقی سەوداســـەر و دیـــنم دەوێ»
مـــن گوتـــم: تـــاکوو بـــە ئاواتـــت بگـــەی دیـــنم دەوێ
هەڵکـــەوێ تـــاوێکی چـــاوێکی لـــە دیـــدارت بکـــەم
تـــا بزانـــی کـــوانێ بـــۆ جـــوانێ دڵ و دیـــنم دەوێ؟
بزگـــوری ڕەش داپـــۆشـــێ ڕوومـــەتی گـــەش تـــا بەکـــەی؟
شـــاعیری گـــەشبیـــنم و کـــوا چـــاوی ڕەشبیـــنم دەوێ؟
ئـــەی پـــەریزادی مـــەهابادی! ئـــەتۆ ون بـــووی لـــە مـــن
تـــۆم هـــەبێ لـــەکوێ پـــەریزادە و پـــەری چـــینم دەوێ

رووتم و یاقووت و ئاوریشمم لە بیر ناچێتەوە
لێوی سوور و ئاڵ و بسکی خاو و چینچینم دەوێ
تۆ نەدیوی بۆیە شەو چاوم لە ئاسمانێ بڕی
تۆ بەدی کەم گرشەگرشی مانگ و پەروینم دەوێ؟
تا وەکوو ساقی ئەجەل نەمداتێ تاڵاوی نەمان
چاوەبڕکە، دەسبزێوی، ماچی شیرینم دەوێ
ژوانی بن سێلە و پەسیوی لاوەتی یادی بەخێر
بۆ ئەوەی پیرانە نەمرم، یادی دێرینم دەوێ
کوانێ ئەو شەوگارە بێدەنگە لە ژوانگەی جێ هەوار؟
کچ رەوەك بوو، من گوتم: هێدی بە! حەجمینم دەوێ
کوانێ ئەو رۆژەی کە سەرچۆپیم دەگرت بانگم دەکرد
دۆم دەوێ، دۆی قۆڵ بە بازن و پەنجە نەخشینم دەوێ؟
شاعیرم جوانی پەرستم، دڵتەڕم، شێتم، لەشۆق
کێوی بژوێن، دیمەنی جوان، دەشتی رەنگینم دەوێ
من بە فرمێسکی رونووی کوێستانی کورد پەروەردە بووم
کوڵمی ئاڵ و چاوی کاڵ و سینگی بەفرینم دەوێ
خۆشەویستی من کچە کوردێکە پاك و نازەنین
باخەوانە پیرەم و باخی بەپەرژینم دەوێ
نامەوێ روو بگرێ تا دەمرێ بە فێڵبازی و درۆ
یاری نازداری لەباری دیاری شەرمینم دەوێ

مــن تەشــیڕێــسێکی وەك شــیرنی «وەفــایی»م بــۆ چــیە؟
کیـــــژی وریــــــای چـــــاوکراوەی فێـــــرە زانیـــــنم دەوێ
بــۆ دەبــێ «زێنــدین» لــە زیندانــم بکــا چــونکە گوتــم:
ئەز «مەم»م، خەستەی خەمم، کوشتەی ئەمم، «زین»م دەوێ؟
نایـــەڵن قـــەت چـــێژی ئـــازادی بـــچێژم مـــن دەنـــا:
خـــوێنی شـــیرینم دەوێ، کـــوا تـــەرمی خـــوێنینم دەوێ؟
بـواری وەم نـادەن لـە نێـو مێرگـە «چـەکۆ» هەڵتووتـەکێم
چـونکە پرسـەی دایکـی مـڵبـەکوێن و سەرشـینم دەوێ
نایـــەڵن ئاســـوودە دانیـــشم لـــە لاپـــاڵی چـــیام
قاسپەقاســـپی خاســـەکەو بـــێ، گرمـــەیی میـــنم دەوێ؟
ئارەزوومـــە هەرچـــی ئینـــسانە بـــە ئـــازادی بـــژی
چـۆن گـەلی دامـاو و دیـل و مـات و خـەمگینم دەوێ؟
نامـەوێ خـوێن بـڕژێ یـا بـۆنی کـەلاکی کـۆن بکـەم
ڕەنگـــی مێلاقـــە و گوڵاڵـــە و بـــۆنی نەســـرینم دەوێ
هەڵپـــەڕین و پێکـــەنین دەبزێـــوێ هەســـتی ناســـکم
کـوا دڵـی پـڕ ئـێش و ئـۆف و جـەرگی بـەبرینم دەوێ؟
دەرزی ئـاژن بـوو دڵـم لـە سـوێی شـەهیدانی نـەمر
بـەس نیـە، مـەودام بـدەن تۆزکـاڵێ تەسـکینم دەوێ
جێـی گـەرم، پـارووی نـەرم خۆشـە، بـەڵام بـۆ مافـی خـۆم
سـێبەری ئەشـکەوتی سـارد و نـوێنی بـەردینم دەوێ

بــۆ بــە زاری مــەزنیخــوازی تاڵــە وەك کــەکرە و زەرەنــد
گــەر بڵــێم مــن پاســەوانی قەســری شــیرینم دەوێ؟
دێــوی شــەڕ ســمکۆڵ دەکــا لــێم و دەبــوڵێنێ دەڵــێ:
بــۆ لــە ســەردانی هــەموو ئێــوە تــەورزینم دەوێ
بــۆ فریــشتەی داد بــە ســینەی پــڕ لــە کینــە و داخــەوە
هاتــە کوردســتان گــوتی: ڕەجــمی شــەیاتینم دەوێ
سـەقز و سەردەشـت و سـابلاخ و سنەی کـرد غـەرقی خـوێن
سـێی تـری ویـستن گـوتی: بـۆ سـفرە حـەو سـینم دەوێ
کــەی ڕەوایــە بــمدەنە بــەر گوللــە یــا ڕاوم بنــێن؟
گــەر گوتــم کــوردم لــە کوردســتانی خــۆم ژیــنم دەوێ
کــورد مەگــەر کونــدە کــە هــەر وێرانــە بــێ هێلانەکــەی؟
نیــشتمانی ئــاوەدانی جــوانی ڕەنگیــنم دەوێ
زۆر بــە ئاواتــم کــە کوردســتانەکەم بــێکێــشە بــێ
ئاشــتیخــوازم کــوا ولاتــی پــڕ رق و قیــنم دەوێ؟
تــا نــەهێڵم شــوێنەواری نالــەباری پەهلــەوی
نەگبــەتی زۆردارەکــان و خۆشــی مــسکینم دەوێ
لاشــەڕم، کــوا بەدفــەڕم، ئەمــما لەســەر مافــی ڕەوام
دەســت و چــەك، ئیمــان و هیــوا و هەســتی ئــاورینم دەوێ
بــۆ ئــەجاتی ئــەم گەلــە کۆیلــە و هــەژار و بێکەســە
گیــانی پــاك و بــیری تیــژ و ڕێگــە ناســینم دەوێ

بۆ بەگژدا چوونی زۆرداری و هەژاری و ناهەقی
کارگەر و جووتێری ئاگا و مستی ئاسنینم دەوێ

سەخت و ناهەموارە ئەم ڕێگایە، کوردی کوڵنەدەر!
بۆ خەباتێکی درێژ خایەن گوڕ و تینم دەوێ

دوای نەجات بۆ ئاوەدانی و خۆشی خاپوورە وڵات
کۆمەڵێکی چاک و پاک و ڕاست و وردبینم دەوێ

بۆ خەباتی هاوبەشی یەکسانی توند و تیژی گەل
لاوی کارامەی بەجەرگ و کیژی سەنگینم دەوێ

کیژ و کوڕ بگرن لە دەوری گۆڕی «هێمن» ڕەشبەڵەک
من کە شینگێڕی شەهیدانم، لەکوێ شینم دەوێ؟

**مەهاباد - ١٣٥٨/١٢/٣**

## خانەنشین

بولبولێـك بـووم لـە ركەیـدا بـە بـەهاری رەنگـین
دوور لـە گـولزار و لـە دیـداری گولاڵـە و نەسـرین
كـازیوە، بـۆ لـك و پـۆپی گـوڵی بـاخی دەفـڕیم
پـەڕ و پـۆم پێـوە نـەما نیمـە ئـیتر هێـزی فـڕین
دەسـتی ئـەو راوكـەرە بـڕزێ كـە بـڕی بـاز و بڕست
سـووری سـوور گـوڵ بـدەم و روو بكەمـە مێرگـی شـین
مـن چـریكەم هـەموو سووچـی چـەمەنی پـڕ كردبـوو
ئێستە نایـە لـە گـەرووم بێجگـە لـە ناڵـەی خـەمگین
من كە شینگێری هەموو سوورە گوڵی پەڕ ـ پەڕ بـووم
رەنگـە هـەر دڕكـی پـەڕیوە لێـرە بكـا بـۆ مـن شـین
مـن كـە بـۆ دیـتنی گـوڵ هێڵـی سـنوورم دەپەڕانـد
هـەر لەسـەر هـەق گـوتنی رووتـە كـرام خانەنـشین
شاوەریـــخنە دەگـــەڕێ وا لـــە دەراوی چـــۆمەڵ
دیـنی دیـنی گوڵـە ئـەو بولبـولی دڵ پـڕ لـە ئـەوین
تـازە دڵخەسـتە وو پەرپەسـتە وو بـێدەسـتەم مـن
وەرە دەر راوكـەری دڵڕەق لـە كـەلێن و لـە كـەمین
تێپـەڕێ هێنـدە بـە ناخۆشـی نەگـەر ژیـنی درێـژ
خۆزگە سەد خۆزگـە بەوانـەی كـەم و ئاسـوودە دەژیـن

شیلان ئاوێ - ١٣٦٠

## ئاپۆلۆی ماج

بــە حیجــابی ئیــسلامیەوە دیــم جــوانیٚ
ماڵــە بابــم ئــای لــەو خەڵــە و خەرمانــە!
نەمــدیبوو مــانگی چاردە وا روونــاك بــیٚ
بــە ســاوی پــاك لــە نێــو جغــزی خەرمانــە

گونــاح نــەبوو، تــێم هــەڵڕوانی، نەترســام
لـــە چـــەمۆڵە و جنێـــو و بۆڵـــەبۆڵی
ئەوی جوان بوو لە رووی ئەودا بە دیم کرد
هەنیـــە، کوڵمـــە، دیـــدە، بـــرۆ، مـــژۆڵی

کــە دیــن نــەبیٚ، دیــنی دەگــۆڕیٚ بــۆ تــۆ
ئەو تەرسایەی بــیٚتــرس رایــمووسی خــاچ
کــچی شــەرمین بــە رووســووری دەنیــشیٚ
لەسەر رووی تۆ شەوێکیش ئــاپۆلۆی مــاج

ورمیٚ - ١٣٦٣/٤/٢

## بارگەی یاران

دێــت و رادەبــرێ وەکــوو ســەروی رەوان مــن چ بکــەم؟
کــە بــە قوربــانی نەکــەم رۆحــی رەوان مــن چ بکــەم؟
قــەدی ئــەم شــۆخە وەکــوو دووخ و خەدەنگــە ئەفــسووس
پــشتەکەم کۆمــە، وەکــوو مــاڵی کــەوان مــن چ بکــەم؟
تــازە هــەنگاوی شــلم کــوانێ دەبــێ بــۆ شــەوڕاو
جوانــە زۆر جوانــە بــەڵێ رەوتــی کــەوان مــن چ بکــەم؟
زەبــری ئــاوزەنگی بــڕا و شــل بــووە دەســتی جڵــەوم
دێ دەنــا پڕمــەیی بــۆر و بــدەوان مــن چ بکــەم؟
ژوانــی خۆشــی هــەڕەتی لاوەتــی دێتــە خەونــم
کــاتی ئاویلکــە دەگــەڵ زیندەخــەوان مــن چ بکــەم؟

شـــەو هـــەتا ڕۆژێ لەبـــەر ئێـــشی لەشـــم ناڵـــەم دێ
دێتە گوێم دەنگی «گەلۆ» و «نیوەشەو»ان من چ بکەم؟
بارگـــەیان تێکـــەوە پێـــچا و بـــەڕێ بـــوون یـــاران
لـــە دنـــێ وا بـــە تـــەنێ پاشـــی ئـــەوان مـــن چ بکـــەم؟
ژیـــانی مـــن ئێـــستە وەکـــوو خـــۆری دەمـــی زەردەپـــەڕە
پـــێم نـــەما تـــین و گـــوڕ و هێـــز و تـــەوان مـــن چ بکـــەم؟
«سروە» هـات خونـچە گـوڵی بـاخی ئـەدەب پـشکووتن
باخـــەوانی گەرەکـــە تـــازە جـــەوان، مـــن چ بکـــەم؟
ئـاو نـەبوو ئـەو دەمـی «هـێمن» مەلـەوانی کـورد بـوو
ئـــاو شـــوکر زۆرە وەرن زوو مەلـــەوان مـــن چ بکـــەم؟

١٣٦٤

## تەوری جەور

دوژمنی کوردی نیە ئەفلەقی دڵڕەق بە تەنێ
ریشەیی خەڵکی عێراقی دەیەوێ هەڵبکەنێ
لە عێراق ناژی شتێکی بەری چاوی بگرێ
هەر بە تەورێ دەبڕێ زاڵمە نەخل و دەوەنێ
عەرەب و کورد و تورك، ئەرمەنیی و ئاشوری
دەگرێ، یا دەکوژێ، وەك بوتێ سەجدەی نەبەنێ
زێڕی چی؟ ئاسنی ژەنگاوی و تیژە سەددام
کۆنە ئاسۆری ئەون ئێستە کە دێنن تەشەنێ
کوشتی، سووتاندی و بردی لە جنووبی ئێران
وەك مەغوولێ کە لە خۆی رازی بکا ئەهریمەنێ

ئـەوی ئـەو کـردی بـە نامـەردی دەگـەڵ کوردسـتان
شـەختە نـەیکرد بـە گـوڵ و نەسـتەرەن و یاسـەمەنێ
مووشـەك و بـۆمبی لـە دێ و شـاری ولاّتـی هـەڵکرد
خـەڵکی ئـاوارە بـوو بـۆ دەشـت و تـەلان و دەمـەنێ
گوللـە دابـاری وەکـوو تـەرزە لەسـەر پـیر و جـوان
تەرزە کـوانێ بـەزەیی دێ بـە گـوڵ و گیـای چـەمەنێ؟
وا بـــلاو بۆتـــەوە جەیـــشی بەپـــەلاماری بـــەجێ
تـــازە کـــۆ بێتـــەوە دژوارە بـــە بێـــڵ و بـــە شـــەنێ
خـۆی بـە نێـرۆن و بـە چـەنگیز و بـە هیتلێـر زانـی
نەیـــدەزانی دەدرێ مـــشتی گرانـــی لـــە چـــەنێ
دەسـتی بێگانـە دنـەی دابـوو کـە خـۆی هەڵـدێرێ
کەچـی راچـوو لـە پـەڕەی جـەرگی، پـەلی دارەبـەنێ
لـــەوەتی هەڵمـــەتی شـــێرانەیی خـــەڵکی دیـــوە
خـــەوی تـــۆراوە، بـــە شـــەو رادەپـــەڕێ، رادەچـــەنێ
ماوەیـەك مەسـتی مـەیی بـەرزەدەماخی بـوو بـەلاّم
کـاتی وەی هـات کـە خومـار بێتـەوە لـووت دابـژەنێ
ئـەو کـە نـەیهات بـەزەیی قـەت بـە هـەژار و بێکـەس
رۆژی تەنگانـە ئـەوان چـۆن دەبـێ دەسـتی نەکـەنێ؟
کـەس نیـە جـەرگی بـە کوچـکێوە نـەنابێ سـەددام
چۆن دەبێ جەرگی ئەویش خەڵکی بە کوچکێوە نـەنێ؟

چۆن دەبێ باکی نەبێ ئەو لە «اخ» و «اخت»ی عەرەب
چۆن نەجاتی دێ لە دەس مامەڕەش و پوورە نەنێ؟
ئەو کەسەی هانی دەدا ئاگری شەڕ رۆشن کا
ناچتە هانای، کە کەوت تێر و پڕیش پێدەکەنێ
تازە رزگاری لە دەس خەڵکی عێراق دژوارە
هێندە پێ ناچێ هەموو دەور و بەری لێ دەتەنێ
چی لە دەس نایە ئەگەر خەڵکی عێراق ئەمڕۆکە
ڕاپەڕن، یەك بگرن، دەس دەنێ، ڕامالّی دەنێ
ئەمەیە ئاقیبەتی شوومی لەخۆبایی بوون
چارەنووسی ئەمەیە دوژمنی خەڵك و وەتەنێ

بەهاری ١٣٦٤

## شینگێری

**بە بۆنەی بۆردمانکردنی شاری بانە لە لایەن فڕۆکەکانی عێـــراق لـــە ١٥ی جــۆزەردانی ١٩٨٤وە گـــــوتراوە.**

بانـــــە وێرانـــــە جگــــەر بریانـــــە
لــەش ســـڕە، دڵ پــــڕە، چـــاو گریانــــە
بـەم بـەهارە گـوڵی وێ پـەڕ ـ پـەڕ بـوون
وا بـــە دەردی خـــەزەڵی پـــاییز چـــوون
جـەرگی مێلاقـە لـە داخـان ڕەش بـوون
ئەشـکی شـللێرە وەریـن و گـەش بـوون
پـیر سولەیـــمان خـەمی دیکــە نابــا
سیـــــــسە دار و دەوەنـــــی ئاربابـــــا

ئەوی شین ماوەتەوە شینگێڕە
هەر گەڵایەکی هەزاران دێڕە
میگ و میراژی بە هاوکاری یەك
چوونە سەر خەڵکی هەژاری بێچەك
زۆر بەرقتر لە قەراری جاران
بانە وێرانە، کرا بۆمباران
هەرچی خانوو بوو لە نزم و بەرزی
وەك دڵی عەسکەری بەعسی لەرزی
هەر بە زار خۆشە دەڵێن شەشسەد کەس
یا نەما، یا نە بە حاڵ ماویە نەفەس
مێشکە پرژاوە لە نێو خۆڵ و خاك
لەت و پەت بوو لەش و ئەندامی پاك
چۆڵەمە، دیزەڵە، ئەژنۆ دەرچوون
ماڵ نەما، یانە رما، یا سەر چوون
دەس پەڕی، مۆرە شکا، سینەش چاك
ژنی پاك رۆیی، برا پیاوی چاك
باش بزانە گەلی دوڕناسی ورد
ئەوەیە هەر هەقی ئەفلەق بۆ کورد
ئەوی هاوسەنگەر و پشت و پاڵمە
دیاری دا دیاری بڕەی ناپاڵمە

شەڕفرۆش بەعسیە ئەی ئێرانی!
شەڕفرۆش چی گەرەکە؟ وێرانی
چ نەهاوەند بێ چ بانە و دزفوول
بەعسی وێرانگەرە ئێستا مەسئوول
شەڕفرۆش مووشەك و بۆمی داوێ
شەڕفرۆش ڕاحەتی ئێمەی ناوێ
زگی ناسووتێ بە حاڵی ئێمە
دڵی کوردە لە ڕقی ئەو کێمە
تێدەگا خەڵکی مەگەر مێشکی ڕزیو
چ دەکا بەعسی بە کوردی ئەو دیو
ئەم قەڵادزەی بە شەهید مەشهوورە
هەر بە ناپاڵمی بەعس خاپوورە
گەوزی لەم شارە لە نێو خوێن و خوڕ
بە سەدا پیر و منداڵ، کیژ و کوڕ
گوندەکانی هەموو لێ رووخاندن
ڕەزەکانی هەموو لێ سووتاندن
کانییەکانی بە سمیت داڕشتن
یانی سەرچاوەیی ژیانی ناشتن
دای لە سێدارە ئەوی بیناسم
چەند هەزاری وەکوو لەیلا قاسم

بــەزەیی کــوا لــە دڵــی بەردیــدا
شــومری ناگــاتێ لــە نامەردیــدا
بــە قــسەی ئــەو ئــەوی خیرەســەر بــێ
دەیکــوژێ بــا کــوڕی پێغەمبــەر بــێ

## جیٚژوان

ئەو پەنجەی وا لە بیٚهێزی دەلەرزیٚ
کوشیویەتی مەمکۆڵەی بالاّبەرزیٚ
ئەو ددانەی ئیٚستیٚ نەماوە تاقی
گەستوویەتی زۆر جار چەنەگەی ساقی
ئەو چاوانەی سۆمایی لیٚ بڕاوە
هێندە لە جوانان داگیرا، داگیراوە
ئەو لیٚوەی وا ئیٚستیٚ باری گرتووە
کولمەی نەرم و نۆڵی یاری گرتووە
ئەو باهۆیەی زەمانە لیٚی بڕی هێز
کام کیژ جوانە گرتوویەتە نێو ئامیٚز
ئەو دڵەی وا ژوانی دەویست و جوانی
ئیٚستا پڕە لە غەم، لە نیگەرانی
ئەو پیٚیانەی شەرزەی کردووە کوتر و کوان
ماندوو نەبوو قەت لە هاتوچۆی جیٚژوان

١٣٤٧

## دەسرێژی لاوان

بــــڕۆ رێـــــوی بەســــیەتی چـــاونەزێری
پـــەلاماریٚ مەبـــە بـــۆ لانـــی شـــێری
گوتوویانـــە لـــە لانـــیٚ دەربـــەڕیٚ شـــێر
هـــەموو دوژمـــنبەزێنـــە مـــیٚ و نێـــری
مەیـــە بـــۆ ئـــەم چـــیا نینـــۆکشـــکێنە
دزی ســـیرمە و گـــەڕۆکی گەرمەســـێری
بە تیکی سەخت و ئەستەم هەڵمەڕۆسکیٚ
خـــەریکی شـــاخەوانان هەڵبـــدێریٚ؟
ئـــەتۆ و ژرد و رکـــە و هەڵـدێر و تـــیرەگ؟
لـــە گیـــانی خـــۆ مەگـــەر بێـــزار و تێـــری؟

بچۆوە بن گرالّك و كەندەلاّنت
ئەتۆ كەی فێری نێو سوێسن و كنێری؟
برۆ كلكت بنێوە نێو گەلّۆزت
هەلاّتن ئیشی خۆتە باشی فێری
لە پێش تۆشدا شەهەنشاهانی خوێنڕێژ
خەریك بوون پێی نەهێلّن خێر و بێری
لەمێژە فێرە كوردی پاكی لاشەڕ
بەرەنگاری، فیداكاری، دلێری
ئەتۆ هەر قاتلّی زارۆك و چووكی
بە دیل و پیر و بێ‌ئەنوا دەوێری
دەنا بێ‌شك لەبەر دەسڕێژی لاوان
دەبێ وەك بارەكەو هەر خۆت وەشێری
حیسابی كاری خۆت گەر باش دەزانی
لە مافی ئێمە بۆچی خۆ دەبوێری؟
كە لێت رووناكە ناهەموارە رێگا
ئەدی بۆ رێ بە رێدار ناسپێری
ئەگەر بالّی هوماش بێ سێبەری تۆ
كە مافی كورد نەدەی ناچیتە ژێری!
عەدالّەت گەر هەبێ پێویستە هەر كەس
لە مالّی خۆی بكا خۆی چاوەدێری

چـــیای زاگرۆســـە زورگ و بەردەڵانـــە
فەلـــەك نـــەیکرد و ناکـــا بەردبـــژێری
بـە تانـك و تـۆپ و میگـی خـۆت مـەنازە
کـە شـوان کـردی بـە سـەنگەر بـەردەبێری
دەنێـــری چـــۆلەکە بـــۆ راوی باشـــوو
کـە جونـدی بـۆ شـەڕی جـووتێر دەنێـری
کـە روونـاکبیر قەڵـەم رۆ کـا لـە چـاوت
کـەڕ و لاڵـی نـەوەك هـەر کـوتر و کـوێری
لـــە بوختـــان و درۆت بێـــزارە یەکـــسەر
لـــە شـــێخی خانـــەقا تـــا پـــیری دێـــری
گەلی کورد دەستی دا چەك هاتـە مـەیدان
تەماشـــای گـــەورە شـــوان و شـــەنگەبێری
کـە ترسـابا لـە کوشـتن تۆرەمـەی کـورد
لـــە ئاســـمانی ژیـــان ون بـــوو ســـتێری
فیـدای کـۆڕی خـەباتت بـم کـچی کـورد
کـــە گیـــانبـــاز و فیـــداکار و بـــوێری
ئەتۆ سـەربەرز و رووسـووری و بـە خوێنـت
گوڵاڵـــەی ســـووری ئـــازادی دەدێـــری
فیدای لوولەی تفەنگەت بـم کـوڕی کـورد
کـــە دوژمـــن بـــەو تفەنگـــەت نـــابوێری

بــە خــەڵکی ڕاگەیانــد دەســت و تفــەنگت
دژی زۆرداری و داخـــــوازی خێـــــری
بــۆی پێــشمەرگە! ڕۆڵــەی باوەفــای کــورد
کــە ناترســی لــە ڕەنــج و تــاڵ و ســوێری
لــە ئاشــتیخــوازی و ســوڵحا نــموونەی
لــە حەملــە و هەڵمــەتا بــێباك و مێــری

١٣٤٢ (١٩٦٣)

## گریانی رونوو

**بۆ شەهیدانی کوردی تورکیا، کە لەوپەڕی نەخۆشیدا گوتراوە.**

ئەی دایکی شەهیدی کوردی!
تــۆ وەکــوو چــیای نــاگری
لەبــەر تــەوژم و بــا و تۆفــان
ســەخت و رەق و پــێداگــری
لە ئاســت ئــەم داخ و دەردانــە
بەهیمــەت و خــۆڕاگری
ســەرت ســپی و بەفراویــە
دەروونــت کڵــی نــاگری
کــێ دەکــا مــەنعی گریانــت
بۆ رونــووی کوێــستان نــاگری؟

# مەحکەمەی ئیستیقلال

ئەم هەڵبەستەی ژێروو چەند دڵۆپە فرمێسکێکە کە لە شینی شەهیدانی ڕێگای سەربەخۆیی کورددا رشتوومە و پێم وایە هەموو کوردێك، چ خوێن‌گەرم بێ، چ خوێن سارد، بە خوێندنەوەی شیعرەکان بێ‌ئیختیار فرمێسك دەڕێژێ و تووك و نەحلەت لەم مەحکەمە مەنحووسە ـ کە ترووسکەی هیوای کوردی کوژاندنەوە و سەربەخۆیی کوردستانی وەدواخست، بێ سووچ و تاوان ئەمری هەڵاوەسینی جەنابی شێخ عەبدولقادر و هاوڕێکانی دەرکرد و لە شینی ئەواندا نەتەوەی کوردی بۆ هەمیشە دەستەو ئەژنۆ دانا ـ دەکا.

دوێشەوێ گریام هەتا ڕۆژ، پێت بڵێم بۆچی برا؟
مەحکەمەی مەنحووسی ئیستیقلال وەبیرم هاتەوە
ریزیان بەستبوو لە پێش چاوی منا گشتی هەموو
ئەم شەهیدانەی کە خنکاون بە سەد ناواتەوە

پاك بە كفنێكی لـە خوێنـا شـەتڵ و لێـوێكی بـەبار
پـاك بـە رەنگێـك و قیـافێكی پـەڕیو و ماتـەوە
هاتە گوێم لێكرا دەیانگوت «ئێمە كوژراین بیٚخـەتا
میللەتی كـورد تـا بـە كـەنگیٚ تۆڵـەمان ناكاتـەوە»
من لەسەر لووتكەی بڵیندی كێوی هەق داوا دەكـەم
تـۆش بپـارێزە جـەنابی شـێخ لەسـەر رووی تاتـەوە
بەڵكوو روحـمێكی بكـا پێمـان خوداوەنـدی رەحـیم
چی دیكە ژێردەس نەبین دیـسان وەسـەرمان خاتـەوە
هێمنـا! پێـت وانـەبیٚ یـەزدانی بـیٚهـاواڵ و فـەرد
كەیفـەری ئـەم زوڵـم و زۆرە، بـیٚحیـساب ناداتـەوە

گۆڤاری نیشتمان، ژمارە ٢، ١٣٢٢ (١٩٤٣) - مەهاباد

## كوردم و ...

کوردم و داوای حقووقی پایەماڵی خۆم دەکەم
ماڵی خۆمە موڵکی کورد، داوایی ماڵی خۆم دەکەم
موڵکی کوردستان کە ئیرسی باب و باپیری منە
ئیدیعای هەق و کەلەپووری حەڵاڵی خۆم دەکەم
هەر وەکوو باران لە چاوم دێتە خوارێ ئەشکی خوێن
هەر زەمانێك بەرژەوەندێکی لە حاڵی خۆم دەکەم
گەرچی لای ئاغای خەیاڵی خاوە میللیەت
من لەلام باشە، هەتا ماوم خەیاڵی خۆم دەکەم

من له دەس بێگانـه قـەت ناکـەم شـکایەت ئـەی رەفیـق
گەر شکایەت کەم لـه چـنگی مـام و خـاڵی خـۆم دەکـەم
ناسـیحا! بـەس پـێم بڵـێ فیکـری مەحاڵـه فیکـری تـۆ
نـسحەتـم نـاوێ ئـەمن فکـری مـەحاڵی خـۆم دەکـەم
رۆژێ شێخم دیت و پێم گوت هەتبێ حیسـسی میللیـەت
پێـی گوتــم مـن چـم لەوانـه داوە، سـواڵی خـۆم دەکـەم
مـن ئـیتر مـاهووت و شـاڵی ئەجنـەبی ناکــەم لەبــەر
رانکوچۆغەی خۆم له بووزووی رەنگی شاڵی خـۆم دەکـەم
چـیدی مـن زەحـمەت لـەبۆ منـداڵی خـەڵکی ناکـشێم
عـیلم و زانـست و هونـەر فێـری منـاڵی خـۆم دەکـەم
یـا دەڕێـژم خـوێنی پـاکی خـۆم لەسـەر ئـەم مەقـسەدە
یانـه فیکـرێ بـۆ بـرای رووت و رەجـاڵی خـۆم دەکـەم
چـاوەدێری رۆژی خۆشـی جێـژنی سەربەسـتیم ئـەمن
گـەر مـودارا وا دەگـەڵ ئـەمرۆژی تـاڵی خـۆم دەکـەم

گۆڤاری نیشتمان، ساڵی یەکەم، ژمارە ٢، خەزەڵوەری ١٣٢٢ (١٩٤٣)

## هەڵدەکەم

مــن کــە بێــدەنگم ئەوێــستا چــاوەنۆڕی هــەل دەکــەم
هەل کە بۆم هەڵکەوت ئەمــجا باسـکمی لـێ هەڵدەکـەم
زۆر بــە ئومـــێدی خــودا لــەو خاکــە پاکــەی دەردەکــەم
دوژمنـــە بێگانـــە ئــاخر چــۆن دەگـــەڵ وی هەڵدەکـــەم
نابێ چیدی داری من بــخوات و لێـی سـوار بـێ حـەریف
داری دامــەی خــۆم لــەبۆ لای خــانی ئاغــا هەڵدەکــەم
نایــــەڵم تـــــاریکی چــــیدیکە ولاتــــم داگـــــرێ
خــوا مــەدەدکار بــێ چــرای زانــستی تێــدا هەڵدەکــەم
وەك جگێن وایە زەمان، هەرکەس جگی خۆی تـێ دەخـا
تا چەقی هــەمووان بهێـنێ مـن جگـی خـۆم پـەل دەکـەم

نامــەوێ مــن ســەربڵیندی خــۆم و دایــمە کۆشــش
بــۆ بڵینــدی و بــەرزی و ئــازاد بــوونی گــەل دەکــەم
قــەت دەگــەڵ بێگانــەکان وەڵلاهــی دانــووم نــاکولێ
مــن کــە شــاهێنم چــلۆن ئــاخر رەفیقــی قــەل دەکــەم؟
هــەر کەســێ دەربــارەیی ئــەو قەومــە بــەد بــدوێ بــرا
وا دەدەم مــستێ لــە زاری مــن ددانــی کــەل دەکــەم
هــەر کەســێ بــۆ لای ســنوور و ســەرحەدی خــاکی وەتــەن
بێ، دەدەم بەردێ لە لاقی، دەسبەجێ ئەو شەل دەکەم
هێندە فێڵاویم کە دوژمن وێم کەوێ تا هەر دوو گوێ
قوم دەبێ، چونکە بە فێڵ ئەو تووشی لیتە و زەل دەکەم
خۆش بێ بووزووی خۆم، چ موحتاجم بە پەشمی خاریجە
تاکوو جاوی خۆم هەبێ، بۆ جامەیی مەلمەل دەکەم؟
سارد و گەرمی رۆژگارم چێشتووە بە خودا گەلێك
بێئەوەی موحتاجی کەس بم موشکلی خۆم حەل دەکەم
دوێشەوێ دایکی وەتەن «هێمن» لە خەودا پێی گوتم:
رۆڵە کرداری حیسابە، کەنگێ گوفتار حەل دەکەم

**گۆڤاری کوردستان**

**ساڵی یەکەم، ژمارە ۲، رێکەوتی ۳۰ی سەرماوەزی ۱۳۲٤ (۱۹٤٥)**

## جێژنی ئازادی

نەوجەوانانی ژیر و وریای کورد
پیرەپیاوانی پیر و ئازای کورد
بێچوە شێرانی چابك و بێباك
تازەلاوانی میللی و خوێن پاك
نەونەمامانی باخچەیی ئاوات
کاربەدەستانی حیزبی دێموکرات
ئەی ئەوانەی کە چاو بە گریان بوون
دژ و داماو، کز و پەرێشان بوون

بـــۆ وەتـــەن ڕۆژ و شـــەو دەگریـــان زار
دیتـــو لـــەو ڕێـــەدا هـــەزار ئـــازار
بـــەشبـــڕاو بـــوون لـــە خۆشـــی و شـــادی
دەرکـــرا بـــوون لـــە بـــاخی ئـــازادی
مـوژدە بـێ لێـو پـاش گـەلێك زەحـمـەت
پاشـــی زۆر ڕەنـــج و تـــاڵی و مەینـــەت
پاشـــی تـــاڵان و جـــەنگ و دەربـــەدەری
پاشـــی کوشـــتار و شـــین و قوڕبەســـەری
پاش وەی سـەد مـەزن، هـەزاران سـەردار
لەســـەر ئـــازادی ڕۆیینـــە ســـەر دار
پاشـی وەی سـەد هـەزار کـوڕی لاوچـاك
دەسـتی دوژمنـان لـە خـوێن و لـە خـاك
گـەوزی بـوو دایکـی بـۆ لـە سـینگی دا
بـەزەیی هـات بـە حـاڵی ئێمـە خـودا
یاریـــدەی دایـــن و کردیـــە مـــەئمور
بە نەجاتدانی کـوردی، هـۆردووی سـوور
میللـــەتی کـــوردی بێکەســـی ڕزگـــار
کـرد، لـە ژێـر چـنگی دوژمـنی زۆردار
کـــوردەواری بـــە جـــارێ ئـــازاد بـــوو
کوردی زۆر غـەمگین، بەکەیف و شاد بوو

ئاشــكرا هــەڵكراوە بــەیرەقی كــورد
هاتەوە دەستی لاوی كورد، هـەقی كـورد
تێپـەڕی رۆژی رەش، نـەما دەمـی خـەم
رۆژی كورد هاتە دەر لـە ژێـر مـژ و تـەم
بـۆ مــە ئـەو سـاڵەكە چـلۆن زسـتان
خۆشـــترە زۆر لـــە مـــانگی جـــۆزەردان
گەرچی ئێستا نـەماوە گـوڵ لـە چـەمەن
وەك گوڵــە رووممــەتی كــوڕانی وەتــەن
ئێـسـتەكانە تــەواوی میللــەتی كــورد
كــچ و كــوڕ، پیــاو و ژن، درشــت و ورد
بــێ‌خــەم و لێــو بەخەنــدە وو شــادن
بۆچـــی؟ چـــونكوو ئەوێـــستە ئــازادن
ئــەی برایـــانی میللـــی و دڵـــسۆز
رۆژتـــان بـــاش و جێژنـــەتان پـــیرۆز
ئــەوی ئـــاواتی ئێـــوە بـــوو دیتـــوو
نیـــشتمان ســـەربەخۆ و ئـــازاد بـــوو
بــەیرەقی جــوانی ئێمەیــە ئێــستا
دەیــشەكێنێ لــە هــەر بڵێنــدێك بــا
كــاری خۆمـــان بــە دەســـتی خۆمانــە
ئێـــستە بــا كــوێر بـــێ چـاوی بێگانــە

تــا هــەزار ســاڵی دیکــە ئیــستالین
هــەر بــژی یــارەبی، بڵــێن ئــامین
چــونکە دەربەســت هــەقی زەعیفانــە
لاگــــری دیــــل و بــــێنەوایانــــە
بــۆ ئــەوەی بێکەســان بکــا مەســروور
پایــەدار بــێ و بــمێنێ هــۆردووی ســوور
پێــــشەوامان بــــژی لــــەبۆ خزمــــەت
کردنــی دیــن و مەزهــەب و میللــەت
رەبی هەر کەس کە دوژمـنی کـورد بـێ
هــەر دوو چــاوی دەرێ و ملــی ورد بــێ
بــمرە «هــێمن» کــە تــۆ لەســەر زیــادی
مایــــەوە، چــــونکوو دیتــــت ئــــازادی

**رۆژنامەی کوردستان**

**ژمارە ١٢، ٢٠ی رێبەندانی ١٣٢٤ - (٩ی فوریە ١٩٤٦)**

## دەمەتەقەی دوو خوێنمژ

**سیراج ئۆغلوو:**

یـــاخوا بـــەخێر بێـــی سەرچاوەکانـــم
خـــوا دەوامـــت دا ئـــارامی گیانـــم

**نووری سەعید:**

خـۆ بـیَئەزیـەتی ئەلـحەملای چـاکی
قـەزا و بـەلاّ دوور، بـۆ وا خـەمناکی؟

**سیراج ئۆغلوو:**

چۆن خەمناک نەبم زۆر پـیس قـەوماوە
دیـــسان کوردەکـــان زۆریـــان هێنـــاوە
هـەموویان داوای هـەقی خـۆ دەکـەن
گەف و هەڕەشـە لـە مـن و تـۆ دەکـەن

دەڵـێن ئـەو خاکـە خـاکی کوردانـە
نایـــەڵێن چـــیدی بیخـــوا بێگانـــە
خـۆ تـۆش دەزانـی کـە کـوردەواری
لە قیسمان بچێ تووش دێن هەژاری
گەنـــم و جـۆی ئـەوە رزق و بـژیومان
نـەوتی ئـەوە رووناکـە دیومـان
ـمە نـەبێ لـە برسان دەمـرین
نەوتـە نـەبێ شـەو کـوێری دەگـرین
دبیرێك بکـــە هـــەتاکوو زووە
ل و فرسـەت لـە دەس نەچـووە

عید:

ت نەکـــەوێ بـۆ دابزرکـــاوی
چـی وەکـوو کـەر لـە قـوڕێ مـاوی
ەتۆ لە کنە خـۆت تـورکی خـوێنمـژی
ەدفـەڕ، شـەڕانی، رێگـر، پیـاوکوژی
تورکی لەوەی پـێش وا خـوێڕی نـەبوون
وەك گورگی برسی بە خشەوە دەچوون
هـەر ئێـوە نـەبوون لـە دەورەی کـەماڵ
لاقـی کوردانـوو دەگـرت وەك گـەماڵ

ژن و منــــداڵ و گـــەورەتان کوشـــتن
خـــوێنی ملیـــۆن و نیوێکـــوو رشـــتن
ئێستاش نەچووە بچێ، وەخۆ کەونەوە
گـــەورە گـــەورانیان لـــە دار دەنـــەوە
بیانگرن، بیانکوژن، بیانـخەنە نێو بەند
ئەفەنـــدم! بەســـم ئـــەتۆ بـــدە پەنـــد

سیراج نۆغلوو:

منـــیش بەشـــی خـــۆم جەزرەبـــەم داون
بـــــەڵام داخەکـــــەم دانـــــەمرکاون
کـورد گیایەکـە هـەر چـەندی بیـدروون
هەڵدەداتـــەوە دیـــسان هەڵەســـوون
تـــەدبیرێکی دی بکـــە ئەفەنـــدی
یابـــا عـــەجایب! بـــۆ وا دڵمەنـــدی

نووری سەعید:

بـرا مـام ئینگلـیس ئاغـای خۆمانـە
هـەتا ئـەومان بـێ خـەمی چـیمانە
پـەنای بـۆ دەبـەین دەیانکـا چـارە
فریویـــان دەدا بـــە پـــووڵ و پـــارە
بۆیـان سـاز دەکـا سـەد شـێخ و مـەلا
بەسـەریان دێـنێ سـەد دەرد و بـەڵا

عەشـــیرەتەکان دێنیێتــە ژێــر بـــار
بـە درۆ و دەرەســە، بـە پـووڵ و دینـار

سیراج ئۆغلوو:
عەجەب تـەرتیبێك دەستت بـە گونـم
ولاتــت پـیس کـرد هەسـتە لـە کـنم
بـــاوی نـــەماوە کەڵـــەك و دهـــۆ
کـورد فریــو نــاخوا ئەبــەدی بــە درۆ
کـوردی ئـەو عەسـرە هێنـدە شـەیتانن
ئەمن و تـۆ و چرچـیل بـە کـەر دەزانـن
وا لامەزهـــەبن کـــوردی ئـــەو دەورە
نـە شـێخیان مـاوە نـە مـەلای گـەورە
عەشـــیرەتەکان هەســـتان لـــە خـــەوێ
پـشتیان لێـك بەسـتووە ئازادیـان دەوێ

نووری سەعید:
کـــەوابێ بـــرا ســـەلا لـــە خۆمـــان
مانگامـــان کـــرد و بـــڕاوە دۆمـــان

گۆڤاری هاواری نیشتمان
ژمارە ١، ساڵی یەکەم، خاکەلێوەی ١٣٢٥

## شینی ژنەکوردێك

(١)

هەی داد هەی بێداد هەی رۆ رۆڵەڕۆ
هەی رۆڵە داخی گرانم بۆ تۆ
هەی کوێنم دەربەدەر رۆڵەی جەوانم
وەی قورِم وەسەر مایەی ژیانم
دایکەکەت بمرێ رۆڵەی نازدارم
دەك نەژیم پاش تۆ شۆڕەسوارم
نەمێنم لەبۆ دەست و جڵەوت
کوانێ، بۆ نایە ئەورِۆ هەوهەوت؟

هـەناوم رەش بـێ بـۆ قـژی رەشـت
جـەرگم خـرا بـێ بـۆ کولـمـەی گەشـت
حـەیف بـۆ چـاوی وەکـوو بادامـت
درێـغ بـۆ بـەژنی وەك نەونـەمامت
رۆڵـە گیـان ئـەتۆ هێـشتا جحێلـی
چ وەخـتی وەیـە مـن بـەجێ بێلـی
هەی داد هەی بێـداد، هـەی رۆ رۆڵـەڕۆ
بریـا مردبـام مـن لـەباتی تـۆ

(٢)

مـنی هـەژاری پـیری زگ سـووتاو
چـۆن پـاش تـۆ بـژیم ئـاخر شـۆڕەلاو
کـونکونـە دڵـم لـەتلەتـە جـەرگم
بـۆ تـۆ تاقانـەی جوانـە مـەرگم
شـەرتە مـن سـەرم بـۆ تـۆ شـین بکـەم
هـەتا بـمێنم بـۆ تـۆ شـین بکـەم
گوڵە گەشەکەم بـۆ سـیس بـووی وا زوو
بـردت بـۆ ژێـر خـاك هـەزار ئـارەزوو
بـۆ بـەجێت هێـشتم بەدبـەختت کـردم
رۆیـشتی بـۆ کـوێ بۆچـیت نـەبردم

منــت بــەجێ هێــشت لــەو کــەلاوەدا
بــۆ خــۆت ڕۆیــشتی بــۆ خزمــەت خــودا
هەی داد هەی بێـداد، هــەی ڕۆ ڕۆڵـەڕۆ
دێ لــە دەروونـــم لەســـوێی تـــۆ بۆســـۆ

(٣)

دەزانـــــی بۆچـــــی ڕۆڵـــــەی نـــــازەنین
دەبەســـتم لەســـەر گـــۆڕت کـــۆڕی شـــین
بۆیــە دەگــریێم ئــەی لاوی خــوێنپــاك
بە جوانەمەرگی تۆیان خــست لــە خــاك
بۆیــە دەگــریێم ئــەو چــەرخی چــەپگەرد
مــاوەی پێنــەدای وەکــوو پیــاوی مــەرد
لەسەر نیشتمان خۆت بە کوشــت بــدەی
هاوخوێنــەکانی خــۆت ڕزگــار بکــەی
بـــەخێوم کـــردی ڕۆڵـــە وەك بـــەران
تـــا بـــۆ نیـــشتمان بتکەمـــە قوربـــان
کەچی تۆی کوشت و نەیهێشت ئاســمان
قوربانییێــك بکــەم مــن بــۆ نیــشتمان
هەی داد هەی بێـداد، هــەی ڕۆ ڕۆڵـەڕۆ
مـــن و نیـــشتمان بـــێکەســـین ئـــەوڕۆ

(٤)

لــه خــاك و خوێنــا ئەگــەر گــەوزیبای

لەسەر ئازادی و سەربەستی، بەخودای

غــەمم نــەدەبوو، بــۆت نــەدەگریام

چــون مردنــی وا زۆر خۆشــە، بــەڵام

رۆڵــە بــە مــەرگی تــەبیعی مــردن

ئەویش بۆ کوردان، عەیبە لـە کـن مـن

حــەیف گیانەکــەم حیزانــە مــردی

حــەیف وەك پیــاوی ئــازا نــەمردی

حەیف ئەی گەنجی خاوێن وەکوو گـوڵ

مـردی و ئـارەزووی مـن نـەبوو حاسـڵ

ئـۆف رۆڵـە مـردی نەگـەییم بـە مـراد

ئۆف رۆڵە مردی و کـورد نـەبوون ئـازاد

هەی داد هەی بێـداد، هـەی رۆ رۆڵـەڕۆ

بـرینی جـەرگم قـەت نـاکرێ پـەڕۆ

**گۆڤاری هەڵاڵە**

**ساڵی یەکەم، ژمارە ۳، بانەمەڕی ١٣٢٥**

## ژوانی ئاغا

چاوەکەم بیستوومە چاوی «نادییە»
ئێستێ بۆ تۆ مایەیی دڵشادییە
خۆت مەلاس داوە ئەتۆ بۆیە لەوێ
ئەو کچۆڵە نازەنینەت خۆش دەوێ!
دیل و گیرۆدە و ئەسیری کاکی خۆم!
ملکەچ و زار و فەقیری کاکی خۆم!
عەقڵ و هۆشی بردی چاوی مەستی وی
شێت و وێت و گێژ و وێژی دەستی وی

بۆیە وا ون بووی و ئیتر نایەوە
ڕاوکەری و داوت لە کۆتر نایەوە
کاکە بیستوومە گرفتاری ئەتۆ!
ئاشقێکی دڵ برینداری ئەتۆ
ئەو کچۆڵە نازەنینشەی چاو کەژاڵ
تۆبەکەی چەند ساڵەیی کردی بەتاڵ
کێ بوو دەیگوت تۆبەیی کۆن ناشکێ
تۆبە خۆ پۆڵا نیە، چۆن ناشکێ؟
وات شکاند و خستتە بەر پێتەوە
ئەستەمە پێم، تازە گاو بکرێتەوە
بەو مووژە بەرگەشتەیەی ئەو دڵبەرە
وەرگەڕای کاکە! لە دین بۆ مەسخەرە
بەژنەکەی، ئیمانەکەت باریك دەکا
زولفەکەی، ڕۆژی گەشت تاریك دەکا
جەرگی لەت کردووی برا، شیری بڕۆی
کەزیەکەی وەك داود، ناهێڵێ بڕۆی
ڕوومەت و کوڵمە و چەنە و بەرخەبەبەی
گووجی پێ هێناوی چۆن ڕێ دەر دەبەی
خەستە وو ڕەنجوور و گێژ و گێلە
کوشتەیی ئەو گەردنەی وەك کێلـ

سینگ و مەمك و پا و پووز و سمتی ئەو
پێی نەهێشتی عەقڵ و هۆش و خورد و خەو
دڵ پەشێوی پەرچەمە ناڵۆزەکەی
شێتی لەنجە و لار و دەست و گۆزەکەی

* * *

ڕۆژێ هاتوچۆ دەکەن چەندین دەڵاڵ
تا فریو دەن ئەو کچۆڵەی چاو کەژاڵ
«جەعفەرئاغا» دیارە یەکجار ماندووە
هێندە هاتوچۆ بکا جازڕ بووە
خۆ «برایمە شەل» هەدادانی نیە
وەك حەسیر وایە لە ماڵی «نادیە»
هێندە بەو زستانە سەختە هات و چوو
وا شۆڕەی گرت، ژنی «سۆفی پەلوو»
دێتەوە لای تۆ دەڵێ «عەولا دلە»:
«ئەو کچەتتیوە دەکا ئێستاش ملە»
پاش ئەوەی زۆر هات و چوون دەستەی دەڵاڵ
دێنەوە خزمەت جەنابت دەست بەتاڵ
ئەو دەمی بۆ خۆت دەچی بۆ کۆیی یار
پێی دەڵێی ئەی دولبەری سیمین عوزار
جەزرەبە و کوێرەوەری و زەحمەت بەسە
بۆ بەرقدا چووی ئەتۆ لەو بێکەسە

ئەی گوڵاڵە سوورە، ئەی تازە نەمام
سیل و دیقم گرت لە سوێیانت، نەمام
ئەی نیگاری چاو خوماری بێوەفا
بەسیەتی بێمەیلی و جەور و جەفا
نازەنینی شۆخ و شەنگی چاو بەڵەك!
ئاسکی دڵناسکی سرك و رەوەك!
مامزی لێو قرمزی خۆش خەت و خاڵ!
مانگی چاردە، ئایەتولعەینی جەماڵ!
چۆڵەمەی ئەستۆم، بوتم، سەروم، گوڵم!
تۆ سەری خۆت چیدی مەشکێنە دڵم
بمدەیە گیانە، لەمێژە تاسوخم
دایکەنە زوو ئەو تومانە تا سوخم

❖ ❖ ❖

«نادییە» خانم لە پێشدا ناز دەکا
سەد بەهانە و سەد درۆت بۆ ساز دەکا
زۆر بەناز و نووزەوە وات پێ دەڵێ:
«چۆن لە نێو خەڵکا دەبێ چاوم هەڵێ
من کە یاری تۆ بم ئاوا رووت و قووت
پاش و پێشی من بکەن تاقمانە جووت
لۆکەیی تێدا نەماوە کلۆجەکەم
پشت و ئانیشکی دەبێ من پینەکەم

نیمــه دەســـماڵ غـــەیری سەرپێـــچی دڕاو
مـــردم و نەمـــدی لەســـەر خـــۆم تاســـکڵاو
لـــەتلەتـــە وەك جـــەرگی تـــۆ دەرپێـــی شـــڕم
جـــا ئـــەوەش نـــاوەڵکراســـە تێـــی تـــڕم
لائەقـــەل پووتێـــك دەبـــێ کەوشـــی کەچـــم
بـــەو قـــوڕ و بـــەو ســـۆڵە بـــۆ ژوان دەردەچـــم؟
ڕەنگـــە تێیـــدا بـــێ ســـەر و پرچـــم گەنـــە
تـــێم نـــەداوە ســـاڵ و نیوێکـــە خەنـــە
مـــن کـــە رووتـــم چەشـــنی ئاســـکی عەربـــەتێ
دوێـــنێ جێـــژن بـــوو نەچـــوومە داوەتـــێ
ســـورمە وو ســـابوون و کلتـــوورم نیـــە
بازنـــە وو خرخـــاڵ و بـــەرموورم نیـــە
چش کـــە شـــك نابـــەم لـــە مـــاڵێ تامەچێـــشت
داخەکـــەم نیمانـــە زارجوویـــەك بنێـــشت
وردەواڵـــە هاتـــە ئێـــرە دوێنەکـــە
نـــەمبوو پـــوولێ خـــشڵ و گـــوارە و مێخەکـــە
هـــەر کـــە هـــاواریێ دەکـــا میـــوەفرۆش
مـــن لـــە ســـوێ ســـنجوو دەروونـــم دێتـــە جـــۆش
قوچـــەکە وو دەرزی و کەڵافیـــشم نیـــە
ئاشـــقی وەك تـــۆ چـــرووکم بـــۆ چـــیە؟»

تۆ دەڵێی: ئەی شۆخی مەستی چاو هەڵۆ
بەسیەتی ئەو پرت و بۆڵە، خەم مەخۆ
ئەی بوتی سیمین و ئەی خوشکی پەری
شەرتە بۆت بکڕم کراسی کوودەری
بەو سەرەی تۆ و بە مەرگی «کاکەباس»
گیانە بۆت دەکڕم کەوا و ئاوەڵکراس
بۆ چمە بە زیاد نەبێ پوول و دراو
جوانی وەك تۆ نەیبێ کەوش و تاسکڵاو
تۆ بەڵێنیم پێ بدە و تەفرەم مەدە
حازرە دەسماڵ و چارۆکە و شەدە
بۆت دەنێرم عەتر و سابوون و خەنە
کرمەك و خرخاڵ و بازنە و ژێرچەنە
مێوژ و سنجوو لە «سەیفوڵڵا عەجەم»
وەرگرە، باکت نەبێ پوولی دەدەم
وێت دەدەم کلتوور و ئاوێنە و دەزوو
کوا قسەت پێماوە، دایماڵە دە زوو

✦ ✦ ✦

بەو قسە خۆشانە سەرگەرمی دەکەی
ورده - ورده، کەمکەمە نەرمی دەکەی
ئیحتیاج دەیکا وەها نەرم و تەبا
بۆت نەرم نابێ ئەگەر موحتاج نەبا

ئیحتیـــاج داوێـــنی ئـــالووده دهكـــا
گـــەر تەســـەل بوو‌بایـــە بـــێ‌شـــك نەتـــدەگا
گـــەر نەبوو‌بایـــە وەهـــا رووت و شـــرۆڵ
خـۆی دەکـرد تەسـلیمی تـۆی چرچـی گـرۆڵ؟
ئیحتیـاج مـەجبووری کـرد و خـۆی فـرۆت
چـی لـە دەسـت نایە دەنـا «پـووره مـرۆت»
ئیحتیـــاج دۆخـــینی پـــێ شـــل کـــردەوه
شـــەرم و نامووســـی لـــە بـــیر ئـــەو بـــردەوه
ئیحتیـــاج کـــردی بـــە دەســـت ئاغـــا نەســـیر
کیـــژی لادێیـــی رەش و رووت و فـــەقیر
ئیحتیاجـــە جـــەرگی کردۆتـــە کـــەباب
هێنـدە جـوانچـاك نـی دەنـا عـالیجـەناب!
جـوانی فـەرموو شـاعیری گـەورەی قـەدیم
ئافـــەرین ئـــەی ســـاحیبی زەوقـــی ســـەلیم
«آنـــچه شـــیران را کنـــد روبـــه مـــزاج
احتیـــاج اســـت احتیـــاج اســـت احتیـــاج[١]»

❖ ❖

لادە شـــاعیر تـــۆ لـــە باســـی فەلـــسەفە
بـــۆ لـــە بـــیرت چـــۆتەوە کـــاتی گەفـــە؟

---

١- هی مەولەوی بەلخیە.

رایدەکێشی عاقیبەت بۆ ئاغەڵێ
دەست دەگێڕی تۆ لە مەمك و باغەڵێ
دەیگری کاکە لە ئامێزی گەرم
لادەچێ پەردەی حەیا و حوجب و شەرم
دەست دەگێڕی تو لە سمت و بەرگەدەی
جا کە لێت رەق کرد، پەلانپیتکەی دەدەی
دەیخەیە سەر گازی پشتێ ئەو گڕە
دەیخەیە بەر هەڵمەتی ئەو تۆپزە
لاقی پێ هەڵدێنی، دادەگری زگی
دەرپەڕی دەعباکە وەك ناوکی جگی
مەترەقەی سەر ئەبلەقەی لێ رادەدەی
دەیترێنی، خۆی وەها پێدا دەدەی
نێوگەلانی ئەو فەقیرە شەق دەکەی
گووپی هەڵدەمسێنی، چاوی زەق دەکەی
دەیبەیە ژووریٚ بە زۆری و چیڕەچیڕ
با بە کەیفی خۆی بکا ئەو زیڕەزیڕ
تۆ ئەوەندەی رادەدەی بۆ پێشەوە
ئەو دەڵێ: کوێر بووم کوڕە بیکێشەوە
تۆ دەڵێی: «خۆت راگرە ئەی بەدمەزەب»
ئەو دەڵێ: «ئێی وای جڕلدم بێتەدەب»

قــەت بــەری تــۆ نــاگرێ ئــەو قــونخــڕە
هــیچ شــکم تێــدا نیــە کوتــك و تــڕە
لێــی دەبــەی ئاغــا هــەتا پرتــی گونــان
«مــی‌نــمایی امتحــان» هــەر دوو کونــان
خــۆی زەوت ناکــا فــەقیری بــێ‌ئــەوا
رەنگــە ئاغــا بــۆت فرێــدا ســاقی وا
نێــو زگ و ریــخۆڵەکانی هەڵتــەکا
جــا چــلۆن بێــچارە خۆشــی پــیس نــەکا
پــاش تــەواو بــوون چــاوی هەڵدێنێتــەوە
جــا بــە نــاز ئــەو شــیعرە دەخوێنێتــەوە:
«گــر جــماع ایــن اســت کــو کــردن خــران[1]
بــر کُــس مــا مــی‌رینــد ایــن شــوهران»

کاکــە! بــمبەخــشە لەبــەر بێکارییــە
ئــەو قــسانە، ئــەو هــەموو بــێ‌عارییــە
لــێم ببــوورە شــاعیرێکی عــاجزم
مــات و دامــاو و پەرێــشان و کــزم
دەرکــراو و بــەش‌خــوراو و دەربــەدەر
رەنــجەڕۆ وو بــێ‌ئــەوا وو قوڕبەســەر

---

١- هی مەولەوی بەلخیە.

مودەتێکــە لــێم حەرامــە مــاڵی خــۆم
نــابینم خــزم و ژن و منــداڵی خــۆم
هــەڵوەدان دیــسانەکە پــۆلیس لــەدووم
بــەو چــلەی زســتانە بۆیــە بــازرە بــووم
دەمتــەقێنن چەشــنی ڕێــوی بەنــدەنێ
ئــەو ســەگانە لای کونێــشم نــادەنێ

✻ ✻ ✻

دەربــەدەر بــووم شــار بــە شــار و دێ بــە دێ
ســەردەمێ ســۆفیم و ڕۆژێکــی فــەقێ
گــا لــە پــشدەر، گــا لــە بیتــوێنم ئــەمن
گــا لــە کوێــستان، گــا لــە گــەرمێنم ئــەمن
ئێــسك و پێــستێکی ڕەقــە بارگینەکــەم
ویــشکەوە نــابێ تەکــەڵتووی زینەکــەم
مــن کــە نەمــدەخوارد پــلاو و گۆشــتی خــۆم
نــانی هــەرزن ئێــستە وەك هــەڵوا دەخــۆم
مــن کــە ڕادەکــشام لەســەر تــەختی فەنــەر
ڕاخــەرم ئێــستا چــیە، کورتــانی کــەر
مــن کــە قــاوەڵتوونێ هەڵدەســتام لــە خــەو
ئێــستە نیمــە ئیــستیراحەت ڕۆژ و شــەو
مــن کــە هــەمبوو کەوشــی بۆیــاخ لێــدراو
ئێــستەکە ڕازیــم بــە کاڵــەی چــەرمی خــاو

مـــن کـــه ئاغـــا بـــووم و پـــۆزم لێـــدەدا
ڕۆزگـــار ئەوڕۆکـــە کردوومیـــە گـــەدا
بەو سـمێڵەی تـۆ و بـە ڕیـشی «کـا حەمـەد»
مەحتەلـم بۆ پـووڵ و ڕووتـم وەك «سـەمەد»
بـــۆ پـــەڕە ســـیغار و تـــووتن ماتـــەڵم
هـــەر دەڵێـــی دەیلاغـــی فێـــرە دووکـــەڵم
دێ بـــە شـــوێنمدا هەمیـــشە ئەمنییـــە
ئەمنییـــەش ئەوڕۆکـــە بـــۆ مـــن کـــەم نیـــە
بـــا ئـــەویش ڕازی بـــە دە تـــمەن بـــێ، بـــرا
جـــیبی مـــن وەڵڵاهـــی گەســـکی لـــێ درا!!
شـوێنە ونکـەی مـن لـە دەسـت ئـاژان دەکـەم
هـەر کـە شـەبکەی ئـەو دەبیـنم ژان دەکـەم
پـــوولی تریـــاکم لـــە کـــوێ بـــوو بیـــدەمێ
جـا لەبـەر وەی، چـاکە فیزمـاڵکی دەمـێ
تـا جـەناب سـەروان وەکـوو ڕۆسـتەم چـەقی
کاکە «هێمن»ی تـۆ لـە حـەوت کێـوان تـەقی
ژیـانی ئێـستەی مـن بـرا بـەو تەرزەیـە
پـێم مەفـەرموو شـاعیرێکی هەرزەیـە
زیـز مەبـە لـێم و مەبـە عـاجز لـە گـەپ
کاغـەز و شـیعرم مـەدە بـەر نووکـە شـەپ

مــــن كـــــه دەركـــــی شـــادمانیم داخـــــرا
گـــەر جەفـــەنگیٚ لیٚنـــەدەم دەمـــــرم بــــرا
مـــن قـــسیٚکی دیـــم نیـــە غـــەیری جەفـــەنگ
وەرنـــە مەعلوومـــە کـــە تـــۆ دووری لـــە نـــەنگ

١٣٢٧

## دڵی شاعیر

دڵی شاعیر وەکوو ئاوێنە دەچێ
گوڵەکەم! تۆ دڵەکەم مەشکێنە
راستە زۆر ناسکە، ئەمما کە شکا
وەکوو خەنجەر دەبڕێ ئاوێنە

## تەرجەمە لە ئەنوەریەوە

هەر بەڵایەك لە ئاسمانەوە بێ
با لەوێشڕا نەهاتبێ بۆ من
کە گەیشتە زەوی دەکا پرسیار:
ئەرێ لە کوێیە ماڵی مام هێمن؟

## بۆچمن؟

ئەی خودای گەورە! خالیقی بێچوون
ئەی ئەوەی دات بە ئێمە زار و قوون
یا ئەوان بگرە یا بکە تێرم
تێر نەبم بۆچمن سەر و ژێرم

## بۆ کچە کوردێک

کچە کوردێکی نەشمیل و لەباری
بەوەی نیە ماوەیێکە چوویە شاری
ئەگەر پێت خۆشە هەروا بتپەرستم
نەکەی لادەی لە دابی کوردەواری

## پەری ئازادی

شینم گەلێك گێڕا و شادیم کەم دیوە
خۆشی دەڵێن هەیە، بەڵام نەمدیوە
هەڵۆەدا بووم لە دووی پەری ئازادی
تووشی نەبووم نە لەو دیو نە لەم دیوە

## بۆ خانمی لازار

ژیانی دووباره دەبەخشیەوە بە مردووی عیشقت
تۆ مەسیحانەفەسی خۆزگە منیش لازار بام

## دیلی دیل

ئەسیری بسکی ئاڵۆزی کچە کوردێکی نەشمیلم
تەماشا کەن چ سەیرێکە بە دەستی دیلەوە دیلم

## شنە

شنە نەبزێوی سەری بسکی رەشی
کە لەسەر روومەتی نارامی گرت
گوێ مەدە ئەو قسە کۆنەی کە دەڵێ:
لەشکری کافرە ئیسلامی گرت

## بۆ ئاغای لبادی دارایی

بە لبادە دەبڕێ سەری پیاوی، لبادیە کوێرە
یارەبی کەس نەخەیە داوی لبادیە کوێرە
ئەی ئەوەی شاخ بە کەر و باڵ بە پشیلە نادەی!
بۆچی سۆمایی هەیە چاوی لبادیە کوێرە؟

## رقی پیرۆز

دەمگرێ، ئەمــما لە گرتووخانە رق ئەستوورترم
لێم دەدا، ئەمــما لەسەر داوا رەواکەم سـوورترم
دەمکوژێ، ئەمـما بە گۆ جەللادەکەمدا دێمەوە
کــوردم و ناتوێمــەوە، ناتوێمــەوە، ناتوێمــەوە

۱۳۵۳ (۱۹۷٤)

## کوردە گیان

لە غوربی خـەوێ دای، دوژمنـت بێـدارە کـوردە گیـان!
هەڵستە لەم خەوە ئیمڕۆکە جەنگەی کارە کـوردە گیـان!

**گۆڤاری نیشتمان**
**ژمارە ٧-٩، بەهاری ١٣٢٤**

## دەستی تەزیو

حەیفە ئەو دەستە کە گوڵزاری دەنەخشاند، بشکێ
حەیفە ئەو دەستە کە دڵداری دەگەوزاند، بشکێ
حەیفە دەستێ کە بە لەرزی و بە تەزیوی دیسان
دوژمنی ملهوڕی زۆرداری دەلەرزاند، بشکێ

١٩٧٦

## کوانێ؟

کوانێ ئەو پەنجە کە توندی دەکوشی مەمکی توند؟
کوانێ ئەو پێیە کە بۆ ژوانێ دەچوو گوندا و گوند؟
کوانێ ئەو چاوە کە هەر جوانی دەبینی و چیدی؟
کوانێ ئەو بیرە کە هەڵدەفڕی بەرەو بەرزی و دوند؟

## پەرستاری رەشپۆش

پزیشکم شەرمەزار بۆوە کە نەیتوانی بکا چارم
دەبێ هیوام بە مان چەند بێ کە رەشپۆشە پەرستارم؟
دەڵێی چۆنی؟ چلۆنت تێگەیێنم دەرد و ئازارم؟
بە ساغیش نەیتوانی هەستی من دەربڕێ گوفتارم

١٩٧٦

## خۆزگە

خۆزگە وەك خۆر نەمدیبایە شەوی تار
خۆزگە تاوێ رامنەبواردبایە بێ یار
خۆزگە پیری کەلەلای نەدەکردم
خۆزگە لە یەکەم ژوانگەدا دەمردم

١٩٧٧

## خاك

بۆت نووسیوم بۆت بنووسم ئـەمن چیـم؟
دوندی قەندیل، گۆڕەپانی هـەڵگورد نـیم
بـــەرەو بـــەرزی دەچـــم ئەگەرچـــی وردم
خـاكی بـەر پێـی تێكۆشـەرێكی كـوردم

١٩٧٨

## خەوم نایە

بەیان ئەنگووت و شەو رابورد و من هێشتا خەوم نایـە
دەخوێنن بولبـول و قـومری، بـەڵام قاسپەی كـەوم نایـە
خـەیاڵ دەمباتـە جـێژوانـی شـەوانی لاوەتـی، ئەمـــا
خرینگـــەی بازنـــە و خڕخـــاڵ و بـــەرمووری ئـــەوم نایـــە

## جوانی رەشپۆش

گوتی: ئەی بلبلە سەرمەستەكە بۆ خامۆشی؟
گوتـم: ئەی نۆ گوڵە خۆڕسكەكە كوا دڵخۆشی؟!
گوتی: ئەی شاعیرە گەشبینەكە بۆ رەشبینی؟
گوتـم: ئەی ناسكە تەڕپۆشەكە بۆ رەشپۆشی؟!